ناسنامەی کتێب

ناو: جوولە

بابەت: لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی

نووسەر: ڕەبیع عەبدولڕەئوف زەواوی

وەرگێر: هۆشەنگ موحەممەد شێخەشەلی

چاپخانە: هێڤی - هەولێر

چاپ: یەکەم/2012

تیراژ: 1000/ دانە

بەرهەم: (136)




لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٨٢٧ )ی ساڵی ( ٢٠١٢ )ی پێدراوە.



07504671394

07501181919

07504885903

hawler.chap@gmail.com

# جوولەکە

## مێژوویان، پیلانەکانیان، پێگەیان، داهاتووی ئیسلام

دانراوی
**رەبیع عەبدولرەئوف زەواوی**

وەرگێڕاوی
**هۆشەنگ موحەممەد شێخەشەلی**

# پێشەکی

سوپاس بۆ خودای جیهانییان، درووود و سەلام بڕژێ بەسەر گیانی گەورەی هەموو نەوەکانی ئادەم، وە بڕژێ بەسەر هەموو بنەماڵە و یاوەر و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی، ئینجا...

بەرچاو ڕۆشنکردنەوەی نەتەوە لەو شوێنانەی کە تیایاندا لە بەرنامەی یەزدان لایداوە، شێوازێکی سەرکەوتووی چارەسەر و ڕێگایەکی باشی دڵنیایە لە ئاراستەکردن و پەروەردەکردن. هەروەها گرنگی بەرچاو ڕوونکردنی نەتەوە لە دوژمنەکەی و شێوازەکانی شەڕ و کەمین و قۆستنەوەی لاڕێ بوونی و خاڵی لاوازی، هیچی کەمتر نییە لەهەر شێوازێکی دیکە، بەڵکو لە هەرە پێویستەکانیشیانە. ئەمە ڕێگایەکی خوداییە، ئەی نابینن خودا لە قورئاندا –فەرموودەی یەزدانمان– چەندە باسی شەیتان و جوولەکە و دیان و دووڕوو و ئەوانیتری بۆ کردووین؟ باسی ئامانج و شێوازەکانی کارکردنیانی بە درێژی و پوختی بۆ کردووین، بەشێوەیەك زۆربەی سوورەتە پیرۆزەکانی قورئان لە باسکردن یان ئاماژەدان بە دوژمنانی ئیسلام خاڵی نین. بۆیە، هەر ئاراستەکردنێك، یان پەروەردەکردنێکی

ئەوەکانی نەتەوەکەمان بەبێ بەرچاوڕوونکردنەوە سەبارەت بە ناحەزانمان و فرت و فێڵەکانیان، ئاراستەکردن و پەروەردەیەکی ناتەواوە و دواتر کاریگەری خراپی لەسەر بیروباوەڕ و خووڕەوشتی تاکی نەتەوەی ئیسلام دەبێت. ئەم کۆششەی ئێمەش هەر لەو سۆنگەیەیە و خوداشمان بەسە، کە ئەو باشترین پشتیوان و هاوکارە.

ربیع عبدالرؤف الزواوی

# بەشی یەکەم

## مێژووی جوولەکە بەکورتی

**سەرەتای سەرهەڵدانیان لە شام:**

(ئیبراهیم) پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێت) لە عێراقەوە بەرەو شام کۆچیکرد. لەگەڵ ئەویشدا پێغەمبەر (لوت) (درووودی خودای لێ بێت) کۆچیکرد. دوای ئەوەی پێغەمبەر لوت (درووودی خودای لێ بێت) بانگی هۆزەکەی خۆی کرد بۆ یەکتاپەرستی و وازهێنان لە تاوانی نێربازی، یەزدانی مەزن فریشتەکانی خۆی ڕەوانکرد تا بەهۆی سەرپێچییان لەناویان بەرێ. فریشتەکان لەلای ئیبراهیم (درووودی خودای لێ بێت) میوان بوون و هەواڵەکەیان پێڕاگەیاند، هەروەها مژدەیشیان بە (سارە)ی هاوسەری ئیبراهیم (درووودی خودای لێ بێت) دا کە کوڕێکی دەبێت بەناوی (ئیسحاق)، چیرۆکەکە بەناوبانگە، خودا دەفەرمووێت:

(فبشرناها باسحاق ومن وراء اسحاق يعقوب)

(یەعقوب) (دروودی خودای لێ بێت) ئەو کەسەیە کە خودا لە قورئاندا بە (ئیسرائیل) ناوی بردووە، نەتەوەی ئیسرائیلیش نەوەکانی یەعقوبن، هەرکەسێکیش ڕێ و ڕەچەڵەکی بچێتەوە سەر پێغەمبەر یەعقوب (دروودی خودای لێ بێت) ئەوا ئیسرائیلییە و نەوەی ئیسرائیل پێغەمبەرە (دروودی خودای لێ بێت). ئەمەش بنچینەیەکی بەرز و شانازییەکی گەورەیە کە جوولەکە بەدەستی خۆیان لەناویان برد و بە گومڕایی و پشت وەرگێڕانیان هەپروون بە هەپرووونیان کرد.

## هاتنیان بۆ میسر

یەعقوب (ئیسرائیل) (دروودی خودای لێ بێت) لە فەڵەستین پێڕاگەیشت، قورئانیش چیرۆکی (یوسف) (دروودی خودای لێ بێت) و برایەکانی بۆمان گێڕاوەتەوە. هەروەك زانایان بۆی دەچن، ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە نزیکەی چل ساڵیان خایاندووە. چیرۆکەکە بە وتەی یوسف بەکۆتا دێت کە دەفەرمووێت (واتونی باهلکم اجمعین). دوای ئەمە، تەواوی بنەماڵەی ئیسرائیل بۆ میسر کۆچیانکرد و لەوێ نیشتەجێ بوون و هیچ کەسێکیان لە فەڵەستین نەمایەوە. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئەوکات ئەوان "خێزانێکی

گەورە" بوون نەك "نەتەوە"یەك. هەرچی دانیشتووانی بنەڕەتی فەلەستینیشن، ئەوا (كەنعانییەكان) بوون.

## فیرعەونەكان جوولەكان دەخەنە ژێر چەپۆكی خۆیان

لە میسر، پێغەمبەر یوسف (دروودی خودای لێ بێت) بانگەوازی میسرییەكانی بۆ یەكتاپەرستی كرد و بە تێپەڕبوونی كات ژمارەی ئیسرائیلییەكان لە میسر زیادیكرد، تاوەكو، بەگوێرەی بۆچوونی مێژوونووسان، ژمارەیان گەیشتۆتە نیو ملیۆن كەس.

لە میسردا و دوای مردنی یوسف (دروودی خودای لێ بێت) تاوەكو هاتنی پێغەمبەر (مووسا) (دروودی خودای لێ بێت)، فیرعەونەكان هەلسان بە چەوساندنەوە و بەكۆیلەكردنی ئیسرائیلییەكان بۆ ماوەیەكی درێژ، لەم ماوەیەدا چەندەها ئازار و چەوسانەوە و شەرمەزارییان چەشت، فیرعەونەكان كوڕەكانیان سەردەبڕین و ژنەكانیان ڕووت دەكردن و پیاوەكانیان دەكردنە كۆیلە، بەجۆرێك كە گوتراوە: (( فیرعەون و داروودەستەكەی وەكو كەر سواری سەر پشتی ئیسرائیلییان دەبوون)).

## مووسا، ئیسرائیلییەکان لە چنگی فیرعەون ڕزگاردەکات

دوای هاتنی مووسا (درووودی خودای لێ بێت)، چەندەها بەسەرهات ڕوویانداوە کە لە قورئانی پیرۆزیشدا باسکراون، لێرەدا تەنها بەشێکیان نیشاندەدەین کە بەڵگەی یەکلاکەرەوەیان لەسەر ڕاددەی خراپەکاری و لادان و سەرلێشێوانی ئاشکرای جوولەکان، تیایە.

کاتێك فیرعەون هەڕەشەی کوشتن و ئازاردانی لە موسا و ئیسرائیلییەکان کرد، مووسا بە هۆزەکەی گوت (استعینوا بالله واصبروا ان الارض لله یورثها من یشاء من عباده والعاقبة للمتقین)، وەڵامی ئەوانیش بەڵگەی نزمی دەروون و گیانی داتەپیوی ئەوان بوو بەهۆی ئەو ژێردەستی و ستەمە دوورو درێژەی بەسەریان هاتبوو، ئەوان گوتیان (اوذینا من قبل ان تاتینا ومن بعد ما جئتنا). بەو مانایەی هیچ ئومێدێك لەو بانگەوازەدا نییە کە تۆ واخەریکیت، فیرعەون لە ڕابردوو و لە ئێستادا هەر ئازاری داوین و هیچ شتێك نەگۆڕاوە.

دوای ئەوەی فیرعەون بەڵگەکانی بینی، بەوە ڕازیبوو کە ئیسرائیلییەکان لەگەڵ مووسا (درووودی خودای لێ بێت) بنێرێت، دواتر پەشیمان بوویەوە، دیسان جارێکیتر ڕازیبوویەوە، فیرعەون

گوتی (یا موسی ادع لنا ربك بما عهد عندك لئن كشفت عنا الرجز لنؤمنن لك ولنرسلن معك بنی اسرائیل).

دواتر فیرعەون بەڵێنەکەی نەبردە سەر و خوداش سروشی بۆ مووسا و هاروونی برای (درودی خودایان لیّ بێت) کرد کە (واوحینا الی موسی واخیه ان تبوءا لقومکما بمصر بیوتا واجعلوا بیوتکم قبلة واقیموا الصلاة وبشر المؤمنین). ئیسرائیلییەکان وەپیر ئەو فەرمانەوە چوون و لەگەڵ مووسادا لە شوێنێکی دوورەپەرێزی میسر و دوور لە فیرعەونەکان خانوویان بۆخۆیان چێکرد و تیایاندا لە دەوری یەکتر کۆبوونەوە و دەستیانکرد بە ئەنجامدانی نوێژ و لە هەر دەروازەیەك کە هەبوو دەگەڕان بۆ ڕزگاربوون لە فیرعەون و هۆزەکەی.

## کۆچکردنیان لە میسر

ئینجا خودا سروشی بۆ مووسا (درودی خودایان لیّ بێت) کرد کە (ان اسر بعبادی انکم متبعون). خوداوەند فەرمانی کۆچکردنی لە میسردا بە مووسا (درودی خودایان لیّ بێت) هاوڕیّ لەگەڵ ئیسرائیلییەکان کرد. یەزدان مووسا (درودی خودایان لیّ بێت) و هۆزەکەی ڕزگارکرد.

ئەمانەش ڕووداوگەلێکی بەناوبانگن کە لە قورئانی پیرۆزدا بەدرێژی و ڕوونی باسکراون.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ڕزگاربوونەی ئیسرائیلییەکان و ئەم دەرچوونیان لەم سەرشۆڕی و کۆیلایەتییە بە گەورەترین بەخششی خوداوەند لەدوای باوەڕ هێنان بە یەزدان دادەنرێت، بەڵام ئیسرائیلییەکان سوپاسگوزاری خودایان لەسەر ئەم بەخششە نەکرد و کاری وایان ئەنجامدا مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ. هەر دوای ئەوەی ڕزگاربوون و چوونە نێو خاکی (سەینا)، بەلای خەڵکی ئاواییەکدا تێپەڕین کە بوتیان دەپەرست، ئیسرائیلییەکان جەنەیان گرت و گوتیان (یا موسی اجعل لنا الها کما لهم الهة)، ئیدی کوفرانەیان بە خودا کرد و بەخششی ڕزگارییان لەبیرچوو. جارێکیان بۆ ماوەیەکی کورت مووسا (درووودی خودایان لێ بێت) جێی هێشتن و چووە سەر کێوی (توور) تا سرووش لە خوداوەندەوە وەرگرێ، لەدوای خۆیەوە سەرپەرشتی ئیسرائیلییەکانی بە هاروونی برای سپارد و پێیگوت (اخلفنی فی قومی واصلح ولا تتبع سبیل المفسدین)، پیاوێکی ئیسرائیلی کە پێیاندەگوت (سامری) هەڵسا زێڕ و خشڵی ژنانی کۆکردەوە و گوێرەکەیەکی زێڕینی دروستکرد کە دەنگێکی لێوە دەردەهات، پێیگوتن: (هذا الهکم واله موسی)، سامری ئەوانی بۆ بۆ

پەرستنی گوێرەکەکە بانگکرد، ئەوانیش، جگەلە کەمێکیان، وەپیر بانگەوازەکەیەوە چوون و پەرستیان. کاتێك هاروون (دروودی خودایان لێ بێت) داوای لێکردن واز لەم کارەیان بهێنن، پێیانگوت (لن نبرح علیه عاکفین حتی یرجع الینا موسی)، بەردەوام دەبین لەسەر پەرستنی گوێرەکەکە تاوەکو مووسا (دروودی خودایان لێ بێت) لە گەشتەکەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر ڕێگەی پێداین دەیپەرستین، خۆ ئەگەر ڕێگریشی لێکردین وازی لێ دەهێنین. مووسا(دروودی خودایان لێ بێت) لە کێوی توور گەڕایەوە، هۆزەکەی خۆی بینی کە هاوبەشیان بۆ خودا بڕیاردابوە، گوێرەکەکەی سووتاند و هاوێشتیە ناو دەریا، هەروەها سەرزەنشتی سامری کرد و سزایدا و تووڕەبوونی خۆی بۆ هۆزەکەی دەرخست. دواتر، مووسا (دروودی خودایان لێ بێت) حەفتا پیاوی زانا و ڕیش سپی هۆزەکەی هەڵبژارد و بردنی بۆ کێوی توور تاوەکو داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن لەو هاوبەش پەیداکردنەی هۆزەکەیان و داوای لێبوردن بۆ هەموو ئیسرائیلییەکان بکەن. کاتێك گەیشتنە کێوی توور و هەور دایپۆشین، مووسا (دروودی خودایان لێ بێت) دەستیکرد بە ڕازونیاز لەگەڵ پەروەردگاردا، زانا و ڕیش سپییان گوتیان (ارنا الله جهرة)، کە وایانگوت برووسکێك لێیدان و هەموویان مردن، ئینجا مووسا (دروودی

خوادیان لێ بێت) داوای له پەروەردگار کرد و ئەویش هەمووانی زیندووکردنەوە و گێڕانیەوە لای هۆزەکەیان و فەرمانیشی پێدان کە (یاقوم انکم ظلمتم انفسکم باتخاذکم العجل فتوبوا الی بارئکم فاقتلوا انفسکم ذلکم خیر لکم عند بارئکم).

زاناکانی ئیسرائیل گومانیان لە ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکەیان هەبوو، چ جای خەڵکی ڕەشۆك و گەمژەکانیان! !

پەروەردگار (تەورات)ی بەسەر مووسا (دروودی خودایان لێ بێت) دابەزاند، کە ڕووناکی و ڕێنوێنی تیابوو و مووسا (دروودی خودایان لێ بێت) فەرمانی بە هۆزەکەی کرد کە تەورات بخوێننەوە و تێیبگەن و جێبەجێی بکەن و پێیەوە پابەندبن، بەڵام ئەوان ڕەتیانکردەوە و یاخی بوون و بیانووی نەتوانینیان هێنایەوە. خودایش کێوی تووری بەسەر سەریانەوە بەرز کردەوە و هەڕەشەی لێکردن و ترساندنی، ئیسرائیلییەکان تەماشایان کرد کاتێك کێوەکە بەسەر سەریانەوە بەرزبوویەوە و هاتە شوێنی هەورەکان، تەنها لەو کاتەدا (بەو ترساندنە) ملکەچی فەرمانی خودا بوون و پەیمانیان بەست کە بە تەوراتەوە پابەند بن، خودا دەفەرموێت (واذ اخذنا میثاقکم ورفعنا فوقکم الطور خذوا ما اتیناکم بقوة واذکروا ما فیه لعلکم تتقون). دوای ماوەیەکی کورت، بەڵێنەکەیان لەگەڵ پەروەردگار شکاند و بەهۆی

ئەمەوە نەفرەتیان لێکرا، خودا دەفەرموێت (فبما نقضهم ایمانهم لعناهم).

ئەم هۆزە لە سەردەمی چەوسانەوەیان بەدەستی فیرعەونکانەوە ئیدی خووڕەوشتیان پیس ببوو، تاوەکو وایان لێهاتبوو بە هێز نەبا نەدەهاتنە ژێر بار و بەپیر بانگەوازی ڕاستییەوە نەدەهاتن مەگەر بە هەستکردن بە ترس و بێ هێزی. ئەم ڕاستەقینەیەش ئێستا و بگرە هەموو سەردەمێکی پێش ئێستاش لە ئیسرائیلییەکان بەدیدەکرێت.

زەوی فەڵەستین پیرۆزە، مووسایش (دروودی خودایان لێ بێت) زۆر هەوڵیدا کە ئیسرائیلییەکان ڕازی بکات کە بچنە ناویەوە، بەڵام سەرنەکەوت و جوولەکە سووربوون لەسەر ئەوەی نەبچنە ناوی، نە لێی نزیك ببنەوە.

خوداوەندی پاك و مەزن دەفەرمووێت (واذ قال موسی لقومه یا قوم اذکروا نعمة الله علیکم اذ جعل فیکم انبیاء وجعلکم ملوکا واتاکم ما لم یؤت احدا من العالمین¤ یا قوم ادخلوا الارض المقدسة التی کتب الله لکم ولا ترتدوا علی ادبارکم فتنقلبوا خاسرین¤).

## ترسنۆکی ئیسرائیلییەکان و
## قەدەغەبوونیانلە چوونە نێو فەلەستین

رێگری بەردەم چوونی ئیسرائیلییەکان بۆ نێو فەلەستین، کە ئەو کات هۆزی زلهێزی لێ نیشتەجێ بوو؛ ترس و بێهێزییان بوو. ئیسرائیلییەکان هۆزێکی ترسنۆک بوون، جگە لە هێز هیچ شتێك ملی پێ شۆڕنەدەکردن، بە شمشێریش نەبووایە ڕاستییان قەبووڵ نەدەکرد، بۆیە گوتیان (قالوا یا موسی ان فیها قوما جبارین وانا لن ندخلها حتی یخرجوا منها فان یخرجوا منها فانا داخلون).
مووسا (دروودی خودایان لێ بێت) زۆر هەوڵی لەگەڵ دان؛ بەڵام ئیسرائیلییەکان —وەك خووڕەوشتی هەمیشەییان— لە پێغەمبەرەکەیان هەڵگەڕانەوە و پێیان گوت (فاذهب انت وربك فقاتلا انا هاهنا قاعدون). مووسایش (دروودی خودایان لێ بێت) ڕووی لە یەزدانی خۆی کرد و فەرمووی (رب انی لا املك الا نفسی واخی فافرق بیننا وبین القوم الفاسقین).
مەبەست لە هۆزی خراپەکارانیش ئیسرائیلییەکانن، ئەوانەی خوداوەند لەدەست فیرعەون و قەومەکەی ڕزگاری کردن و ویستی بە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خۆی بەرزیان بکاتەوە، بەڵام ئەوان بە

سەرپێچیان کرد، خۆیان نزم کردەوە. بۆیە خودا سزایەکی بەسەردا بەرامبەر بوو لەگەڵ ئەو سەرپێچییەی ئەنجامیاندابوو، خودا دەفەرمووێت (فانها محرمة عليهم اربعين سنة يتيهون فى الارض ولا تاس على القوم الفاسقين).

ئەمەش مانای ئەوەیە کە پەروەردگاری جیهان چوونی ئیسرائیلییەکانی بۆ نێو فەڵەستین بۆ ماوەی چل ساڵ قەدەغەکرد. لە ماوەی ئەو چل ساڵەشدا، لەنێو بیابانی سینائدا سەرگەردان بوون و نە توانیان لێی دەربچن، نە بچنە نێو خاکێکی دیکەوە.

بەر لە تەواوبوونی ماوەی سزاکە، مووسا و هاروونی برای (دروودی خودا لە هەردووکیان) بەرەو لای پەروەردگاری خۆیان بەرزبوونەوە و کۆچی دواییان کرد. یوشەعی کوڕی نوون بووە جێنشینی مووسا (درووی خودایان لێ بێت) بەسەر ئیسرائیلییەکان و ماوەی سزاکە بەکۆتا هات. یوشەع سەرکردایەتی هۆزەکەی کرد بۆ جەنگان لە دژی زلهێزەکان کە دواجار شکاندنی و لە فەڵەستینی وەدەرنان، خوداش دیسانەوە بەخششی بەسەریاندا باراندەوە، هەروەك دەفەرمووێت (واورثنا القوم الذين كانوا يستضعفون مشارق الارض ومغاربها التى باركنا فيها).

## دوای سەرکەوتن دەستدەکەنەوە

## بە خراپەکاری، بابلییەکان بەسەریاندا زاڵ دەبن:

دوای ماوەیەك، جوولەکە گەڕانەوە سەر پیادەکردنی خراپەکاری و تاوان و زیادەڕۆیی. خوداش بابلییەکانی خەڵکی عێراقی بەسەرکردایەتی (بوختنەسر) بەسەردا زاڵکردن. بابلییەکان ماڵی جووەکانیان تاڵان کرد و زۆریان لێ کوشتن و بەیتولمەقدیسیان کاولکرد و تەوراتیان دڕاند و سووتاند. تابووتەکەشیان بردە وڵاتی خۆیان، کە سنووقێك بوو پاشماوەی جێماوی بنەماڵەی مووسا و هاروونی تیادا هەڵگیرابوو.

داگیرکاری بابلییەکان سەدان ساڵی خایاند. لەو ماوەیەدا، جوولەکە بە سەرشۆڕی و چەوسانەوە و کۆیلەیی و دەردەسەری ژیان، کە زۆری کەم نەبوو لەو ئازارەی باوك و باپیرانیان بەدەستی فیرعەونەکان لە میسر چەشتبوویان.

## سەرکەوتنیان بەسەر بابلییەکان

چەندەها نەوە لەژێر ئەو داگیرکارییەدا ژیان، تاوەکو نەوەیەك پێراگەیشت کە ئارەزووی سەربەخۆیی هەبوو و حەزی لە شەڕکردن

بوو لەڕێگای خودا. ئەم جۆرە خەڵکەی ئیسرائیلییەکان چوونە لای پێغەمبەری ئەوکاتەی خۆیان و پێیان گوت: (ابعث لنا ملكا نقاتل في سبيل الله)، واتە: سەرکردەیەکمان بۆ دیاریبکە لەپشتییەوە بجەنگین و لەژێر ئاڵاکەی تێبکۆشین، پێغەمبەرەکەیان پێیگوتن: (هل عسيتم ان كتب عليكم القتال الا تقاتلوا)، واتا: دەترسم شەڕتان لەسەر بنووسرێ کەچی ئێوە نەیکەن و نەتوانن ئارامی لەسەر بگرن، چونکە پێغەمبەرەکەیان ئەوانی دەناسی و دەیزانی هۆزێکی ترسنۆک و بێئارام و بێتوانان، ئەوانیش گوتیان (قالوا وما لنا الا نقاتل في سبيل الله وقد اخرجنا من ديارنا وابنائنا)، پێغەمبەرەکەیان گوتی (ان الله قد بعث لكم طالوت ملكا)، هەرکە گوێیان لەو ناوە بوو ڕەخنەیەکی توندیان لەو هەڵبژاردنە گرت، هەرچەندە خۆیشیان داوایان لە پێغەمبەرەکەیان کردبوو کە یەکێکیان بۆ دیاریبکات، ئەوان گوتیان (قالوا انى يكون له الملك علينا ونحن احق بالملك منه ولم يؤت سعة من المال)، بەزەحمەتییەکی زۆرەوە پێغەمبەرەکەیان توانی ڕازییان بکات کە زۆری ماڵ و سامان پێوەر نییە بۆ هەڵبژاردنی فەرماندەی لێهاتوو هەروەك ئەوان بۆی دەچن. هەروەك سێ هۆکاری بۆ ژماردن کە لەدواوەی هەڵبژاردنی تالووتەوە بوون:

**یەکەمیان:** خوا ئەوی هەڵبژاردووە (ان الله اصطفاه عليكم).

**دووەم:** زۆری توانای زانستی و جەستەیی (وازادە بسطة فی العلم والجسم).

**سێیەم:** یەکێك لە موعجیزەکانی خوداتان بۆ دادەبەزێت و بۆتان ئاشکرادەبێت خودا تالووتی بەسەر ئێوە کردۆتە پاشا. موعجیزەکەش ئەوەیە کە ئەو تابووتە بۆتان دەگەڕێتەوە کە بابلییەکان بۆ وڵاتی خۆیان بردووە. خودا دەفەرموێت (ان اية ملكه ان يأتيكم التابوت فيه سكينة من ربكم وبقية مما ترك ال موسى وال هرون تحمله الملائكة). دواجار، جوولەکە ڕازیبوون کە تالووت پادشایان بێت. ئەویش بەرەو دوژمن سەرکردایەتی کردن. لە ڕێگادا، پادشا ویستی جەنگاوەرە ڕاستەقینەکانی سوپاکەی تاقیبکاتەوە. پێیگوتن: (ان الله مبتليكم بنهر فمن شرب منه فليس منى ومن لم يطعمه فانه منى الا من اغترف غرفة بيده).

سەیر ئەوەیە ئەو جەنگاوەرە جوولەکانە بای هێندەیان باوەڕ و توانا نەبوو کە لەو ڕووبارە بپەڕنەوە بێ ئەوەی لێی بخۆنەوە، (فشربوا منه الا قليلا منهم)، ئەو ژمارە کەمەی لە ئاوەکەشیان نەخواردبوویەوە، هەرکە دوژمنیان بینی لەترسان خۆیان بۆ نەگیرا و هاواریان لێ هەڵسا (لا طاقة لنا اليوم بجالوت وجنوده)، (جالووت) فەرماندەی هێزی دوژمن بوو. ژمارەیەکی زۆر کەم لە جەنگاوەرانی

راستەقینە مازەوە، کە بانگیان کردە ئەوانەی بەر لەوەی دوژمن بیانشکێنن: لەلایەن دەروونی خۆیانەوە شکێنرابوون (کم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة باذن الله والله مع الصابرين). بەرلەوەی شەڕی گەورە دەستپێبکات، زۆرانبازی تاکەکەسی لەنێوان جەنگاوەرە بەهێزەکانی هەردووک سوپا دەستیپێکرد، ئەنجامەکەشی (وقتل داود جالوت)، (داود) پێغەمبەریش (دروودی خودای لێبێت) یەکێك لە جەنگاوەرانی سوپای ئیسرائیلییەکان بوو.

## پێکهاتنی شانشینی جوولەکە لەسەر دەستی سولەیمان :

خودا وای دانا کە بەهۆی ئەو لێهاتووییەی کە خۆی پێیدابوو، شانشینی ئیسرائیلییەکان لەسەر دەستی (سولەیمان) پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) لە وەڵامی ئەو داوایەیدا کە لە خودای کرد، پێکبێت، ئەو داوای لە یەزدان کرد (قال رب اغفر لى وهب لى ملكا لا ينبغى لأحد من بعدى انك انت الوهاب). پەروەردگاریش دەسەڵات و سامانێکی هێندە زۆری دایە کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای تەنیبوویەوە.

## دووباره گەڕانەوەیان بۆ خراپەکاری و داگیرکرانیان لەلایەن ڕۆمەکان و چەوسانەوەیان بەدەستی ئەوان:

ماوەیەك بەسەر ڕۆژگاری سولەیماندا تێپەڕی کە جوولەکە گەڕانەوە سەر کارە خراپەکانی پێشوویان و پێغەمبەرانیان کوشت و فەرمانیان بە خراپە و دژایەتی چاکەیان کرد، هیچ خراپەیەك نەما ئەنجامی نەدەن، پەروەردگاریش بە ژێردەستی و سەرشۆڕی سزایدان و ڕۆمەکانی بەسەردا زاڵ کردن. ڕۆمەکان خراپترین ئەشکەنجەی جوولەکەکانیان دەدا، ئیدی جوولەکە دەربەدەر بوون و لە هەموو پارچەیەکی زەویدا سەرگەردان دەسووڕانەوە و لەنێو دۆزەخی بندەستیدا خولیان دەخوارد، جۆرەها بەڵا و ناخۆشییان دەچەشت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، خودا ستەمی لەوان نەکردبوو، بەڵکو ئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردبوو. ئیدی، ئەو سەرگەردانییە قینێکی ترسناك و بەخیلی و ویستێکی بەهێزی تۆڵەسەندن و خۆ بەگەورە زانینێك لەسەر هەموو خەڵك بەڵکە ئەمە قەرەبووی گەورەیی لەدەستچوویان بۆ بکاتەوە و نزمی دەروونیان داپۆشێ، بەرامبەر هەموو نەوەیەکی ئادەم (دروودی خودای لێبێت) لەنێو دڵی جوولەکان چاند، ئەوان گوتیان (نحن أبناء الله وأحباؤه)، هەرچەندە ئەوان سوور دەیانزانی کە لە هەموو مێژووی خۆیاندا هیچ

بەڵگەیەکیان نییە کە ئەم قسە درۆیینەیان بسەلمێنێت، ئەوان نە
کوڕی خودا بوون و نە خۆشەویستی، گەلێکی هەڵبژێردراویش
نەبوون، بەڵکو باشترین پێناسەیەك بۆ ئەوان ئەوەیە کە ئەوان
خەڵکانێکن کە لە ئامانجی شەیتاندا بەژدارن و کارەکانی شەیتان
جێبەجێ دەکەن. شەیتان داوا لە لایەنگرانی دەکات کە وابکەن بچنە
نێو دۆزەخەوە، واتا ئەو ئامانجەی شەیتان کاری بۆ دەکات بریتییە
لە بێبەش کردنی خەڵکی لە بەهەشت، ئامانجی جوولەکەش بریتییە
لە بێبەش کردنی جیهان لە ئاسایش و ئارامی.

**کۆچکردنیان بەرەو دوورگەی عەرەبی:**

جوولەکە تەماشایان کرد، هیچ پەنایەکی بێ کێشەیان جگەلە
دوورگەی عەرەبی بۆ هەڵاتن لەدەست ستەم و زۆرییەکانی ڕۆمەکان و
مەسیحییەکان نەدۆزییەوە. جوولەکە بەرەو دوورگەی عەردبی
کۆچیان کرد، کە ڕۆمەکان هیچ دەسەڵاتێکیان لەوێدا نەبوو،
ئیسرائیلییەکان چوون و لە یەسریب و خەیبەر و شوێنانی تر
نیشتەجێ بوون.

تەورات موژدەی هاتنی پێغەمبەرێکی نوێی لەنێو چیاکانی (فاران)
دابوو، کە ئاماژەیە بۆ (مەککە)ی پیرۆز، هەر لە تەوراتیشدا هاتبوو

که شاری یەسریب دەبێتە پایتەختی شانشینەکەی و ئەو شوێنەی که پێغەمبەرەکە کۆچی بۆ دەکات. بۆیە جوولەکە پێش هاتنی ئەو پێغەمبەرە خۆیان گەیاندە یەسریب، تاوەکو ئەو پێغەمبەرە لەوان بێت و لە ستەمی ڕۆمەکان و دیانەکان ڕزگاریان بکات. یەزدان پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانەکرد، هەرکە جوولەکە زانیان که پێغەمبەری نوێ لەوان نییە و لە عارەبانە، کینەی دڵیان جووڵایەوە و بەخیلی دەروونیان سەریکرد، هەرچەندە کە ئەوان (يعرفونه كما يعرفون أبنائهم).

## ناپاکی کردنی جوولەکە لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) و دەرکردنیان لە شاری مەدینەی پیرۆز:

جوولەکە لە هەموو ئەو پەیمان و بەڵێنانەی کە -بەنووسین- لەگەڵ پێغەمبەری خودا (درودی خودای لێبێت) بەستبوویان پاشگەزبوونەوە و پیلانیان لەدژی موسوڵمانان ئەنجامدا و لەگەڵ قوڕەیشییەکان کلکیان کردە یەك، هەروەکو ئێستا لەگەڵ موسوڵمانان ئەنجامی دەدەن. هیچ هەوڵێکی چاکسازی لەگەڵیاندا سوودی نەهێنا، وەپیر بانگەوازکەری ڕێگەی خودا نەچوون، هەرچەند سوور دەیانزانی کە ئیسلام ئاینی ڕاستەقینەیە. ئەوان پابەندی

ڕێکەوتننامەکانی ئاشتی و چاکەی هاوسێیەتی لەگەڵ موسوڵمانان نەبوون، بەڵکو پشتیان لەوانە کرد و پەیمانەکانی خۆیان نەبردە سەر، هیچ ڕۆژێك ئەوانە لەگەڵ موسوڵمانانندا لە دوورگەی عەرەبی بەبێ فێڵ و ناپاکی نەژیاون. کار هاتە سەر ئەوەی کە هیچ ڕێگەچارەیەك لەگەڵیان دادی نەبوو جگە لەوەی لە شاری مەدینەی پیرۆز وەدەربنرێن. حەزرەتی پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێت) لە شاری مەدینەی پیرۆزی وەدەرنان. سەیریش لەوە دایە، بەدرێژایی مێژوو و لە هەموو ڕۆژگار و شوێنە جیاوازەکانی دونیا، وەدەرنان و دەرکردنی جوولەکان تاکە ڕێگەچارەی گونجاو بووە بۆ دووربوون لە خراپەکارییەکانیان.

پەرتووکەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێت) و مێژوو باسی ئەو کارە دزێوانەیان کردووە کە جوولەکە دژ بە پێغەمبەریان ئەنجامداوە. ئەو کەسەی لەو ڕووداوانەش بکۆڵێتەوە بەڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە هیچ ڕێگەچارەیەك بۆ کێشەی ئەمڕۆی جوولەکە نییە جگەلە وەدەرنانیان لە خاکی موسوڵمانان. پێغەمبەری خودا (درووودی خودای لێبێت) کە ڕێنیشاندەر و ڕابەری ئێمەیە، –دوای ئازارچەشتن و ئارامگرتن– هیچ ڕێگەچارەیەکی بۆ کێشەی جوولەکە نەدۆزییەوە جگەلە دەرکردنیان لە شاری مەدینەی پیرۆز. لەدوای

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێبێت) جێنشینە پیرۆزەکانی (خودایان لێ ڕازیبێت) چارەیەکیان بۆ ئەو کێشە نەدۆزیەوە مەگەر ئەوەی کە لە دوورگەی عەرەبییان دەرپەڕێنن. جوولەکە دەردن و دەرکردنیان دەرمانە و ڕێکەوتننامەکانیش ئارامکەرەوەن.

# بەشی دووەم

## باسکردنی جوولەکە لە قورئان

ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان بەوە هەیە کە خودای پەروەردگار بە هەموو شتێك زانایە، وە ڕازین بە فەرمانی ملکەچیمان بۆ پەروەردگارمان کە ئایەتە پیرۆزەکانی وەکو چرا بن بۆ زانینی کاروبارەکانی دەوروبەرمان و جیاکەرەوەی نێوان ڕاستی و پووچی ن. خودای ئێمە باشتر لە ئێمە دوژمنەکانمان دەناسێت، بۆیە زۆر باسی جوولەکانی بۆ کردووین، جوولەکە:

١. خەڵکانێکی سەرشۆڕن: خودا دەفەرمووێت (وضربت عليهم الذلة والمسكنة وباءوا بغضب من الله).

٢. ناپاکن: خودا دەفەرمووێت (أو كلما عاهدوا عهدا نبذه فريق منهم بل أكثرهم لا يؤمنون).

٣. خۆیان بە زل دەزانن: خودای گەورە دەفەرمووێت (أفكلما جاءكم رسول بما لا تهوى أنفسكم استكبرتم ففريقا كذبتم وفريقا تقتلون).

٤. خراپەکارن: پەروەردگاری مەزن دەفەرموویّت (ویسعون فی الارض فسادا والله لا یحب المفسدین).

٥. گوتوویانە خودا منالّی هەیە: خودای گەورە دەفەرموویّت (وقالت الیهود عزیر ابن الله وقالت النصاری المسیح ابن الله ذلك قولهم بافواههم یضاهئون قول الذین کفروا من قبل قاتلهم الله أنی یؤفکون).

٦. گویّرەکە زیّرەکەیان پەرستووە: خودای مەزن دەفەرموویّت (اذ واعدنا موسی أربعین لیلة ثم اتخذتم العجل من بعده وانتم ظالمون).

٧. پیّغەمبەرانی خودایان شەهید کردوون: ئافەریدکاری گەورە دەفەرموویّت (کلما جاءهم رسول بما لا تهوی انفسهم فریقا کذبوا وفریقا یقتلون).

٨. پیاوانی ئاینیی خۆیان بەخودا دانان: پەروەردگار دەفەرموویّت (اتخذوا احبارهم ورهبانهم اربابا من دون الله).

٩. وەدوای شەیتانیّ کەوتن: پەروەردگار دەفەرموویّت (واتبعوا ما تتلوا الشیاطین علی ملك سلیمان).

١٠. کتیّبگەلیّك بەناوی پیرۆزییەوە بەدەستی خۆیان دەنووسنەوە: خودا دەفەرموویّت (فویل للذین یکتبون الکتاب بایدیهم ثم یقولون

هذا من عند الله ليشتروا به ثمنا قليلا فويل لهم مما كتبت ليديهم
وويل لهم مما يكسبون).

١١. وشه له شوێنی خۆی دەشێوێنن: خودای بەرز دەفەرمووێت (من الذين هادوا يحرفون الكلم عن مواضعه ويقولون سمعنا وعصينا
واسمع غير مسمع وراعنا ليا بألسنتهم وطعنا فى الدين).

١٢. له هەموو خەڵك زیاتر بە دونیاوە پەیوەستن: خودای جیهانییان دەفەرمووێت (ولتجدنهم احرص الناس على حياة).

١٣. دڵڕەقن: پەروەردگاری مەزن دەفەرمووێت (فبما نقضهم ميثاقهم لعناهم وجعلنا قلوبهم قاسية).

١٤. گوێ له درۆ دەگرن و ماڵی حەرام دەخۆن: یەزدانی گەورە دەفەرمووێت (سماعون للكذب أكالون للسحت).

١٥. له تاوان و شەڕانگێزیدا پێشبڕکێیانە: پەروەردگار دەفەرمووێت (وترى كثيرا منهم يسارعون فى الاثم والعدوان).

١٦. ئاگری شەڕ هەڵدەگیرسێنن: خودای پاك دەفەرمووێت (كلما أوقدوا نارا للحرب أطفأها الله).

١٧. بێبەشکراون له بەزەیی خوداوەند: خودا دەفەرمووێت (قل هل أنبئكم بشر من ذلك مثوبة عند الله من لعنه الله وغضب عليه وجعل

منهم القردة والخنازير وعبد الطاغوت أولئك شر مكانا وأضل من سواء السبيل).
هەروەها دەفەرمووێت (لعن الذين كفروا من بنى اسرائيل على لسان داوود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون).

# بەشی سێیەم

## جوولەکە و شێواندنی قورئان

### جوولەکە و کتێبە پیرۆزەکەیان

تەوراتی شێوێندراو -کە بە دەستی جوولەکەی دەروون نەخۆش دەستکاری کراوە- وێنای خودای مەزن و پێغەمبەرەکانی بە شێوەیەك کراوە کە لە هیچ کتێبێکی پیرۆزدا هاوشێوەی نییە. لە هیچ کتێبێکی پیرۆزدا خراپەکاری و داوێن پیسی وەکو ئەوەی نێو تەوراتی شێوێنراو برەوی پێ نەدراوە. دەی با بەیەکەوە نموونەی ئەمە ببینین:

١. خودا لەگەڵ یەعقوب پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) زۆرانێ دەکات، یەعقوب دەیبەزێنێت. نووح پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) سەرخۆش دەبێت و خۆی ڕووت دەکاتەوە و گاڵتەدەکات! ((بەشی دروست بوون لە تەورات)).

٢. سولەیمان پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) لەگەڵ هەزار ژن نێکەڵ دەبێت، دواتر جگەلە خودا کڕنووش بۆ خودای ئەو ژنانە دەبات و پەرستگا بۆ بتان دروستدەکات! ((بەشی پاشا کۆنەکان)).

٣. پێغەمبەر لووت (دروودی خودای لێبێت) لەگەڵ کچە گەورە و بچووکەکەی خۆیدا داوێن پیسی ئەنجامدەدا! ((بەشی دروست بوون)).

٤. کوڕی یەعقوب پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەستدرێژی سێکسی دەکاتە سەر ژنی باوکی (زڕ دایکی)! ((بەشی ساموێلی یەکەم)).

٥. داود (دروودی خودای لێبێت) داوێن پیسی لەگەڵ ژنی یەکێك لە ئەفسەرانی سوپاکەی ئەنجامدەدات و خوێنی بێتاوانان دەڕژێنێت، وە کاتێکیش بەساڵدا دەچێت، لەگەڵ کچانی کەم تەمەندا دەخەوێت تاوەکو تووشی لەرزۆکی دەبێت! ((بەشی سرووودی گوتنەوە)).

٦. کوڕی داود (دروودی خودای لێبێت) داوێن پیسی لەگەڵ خوشکی خۆیدا دەکات! ((بەشی سروودەکان)).

## جوولەكە و تەلموود

تەلموود بریتییە لە شیكردنەوەی تەورات و فەرمانگەلی ودركیراول
هەمان كتێبەوە لەلایەن زانایانی ئاینیی جوولەكەوە –هەروەكو راو
بۆ دەچن– ئەم كتێبە سەرچاوەی بیروباوەڕ و یاساكانیتیاز.
جوولەكە تەنانەت زیاتر لە تەوراتیش پشت بە تەلموود دەبەستن، با
بەیەكەوە سەیرێكی بكەین دا بزانین چ دەستێكی شەیتانی ئەمان
دەجوولێنێت و بڕوایان بە چ بنەمایەكی پووچ هەیە:

١. لەلای ئەوان، خودا لە تووڕەیی و درۆ و كەمتەرخەمی بەدەر نییە.

٢. ڕۆژ لەلای ئەوان دوانزە كاتژمێرە، لە سێ كاتژمێری كۆتاییدا خوداوەند لەگەڵ نەهەنگی پاشای ماسییان دادەنیشێت.

٣. عیسای دیان دەچێتە نێو ئاگر، دایكیشی ئەوی لە خوێنرێژێك پەیداكردووە.

٤. بێگانەكان (واتا خەڵكانی جگەلە جوولەكە) وەك سەگ وان.

٥. نەتەوەكانی دیكەی جگەلە ئیسرائیلییەكان كەرن وماڵیشیان وەك تەوێڵە وایە.

٦. قەدەغەیە جوولەكەیەك یەكێكی غەیرە جوولەكە ڕزگاربكات.

٧. ئەوەی یەكێكی بێگانە بكوژێت، بە نەمری نێو بەهەشتێ خەڵات دەكرێت.

٨. خودای جوولەکە لەو کەسە خۆشنابێت کە ماڵێکی دۆزراوە بۆ خاوەنە ناجوولەکەکەی دەگەڕێنێتەوە.

٩. دزی کردن لە جوولەکان ڕێگەی پێنەدراوە، بەڵام لە بێگانان ئاساییە.

١٠. سوو خواردن لەنێوان جوولەکان خۆیاندا قەدەغەیە، بەڵام لەگەڵ خەڵکانی ناجوولەکە ڕێگەی پێدراوە.

١١. ڕێگە بەوە دراوە کەسێك قەرز بە سوو بداتە منداڵەکانی خۆی، تاوەکو تامەکەی بچێژن و ئەوانیش لەگەڵ کەسانی ناجوولەکە ئەنجامی بدەن.

١٢. ئەو سوێندەی جوولەکەیەك لەگەڵ کەسێکی بێگانە دەیخوات هیچ بایەخێکی نییە و جوولەکە بەهیچ شتێکەوە پەیوەست ناکات چونکە سوێند لەنێوان جوولەکە و ئاژەڵاندا نییە.

١٣. ڕێگەی پێدراوە —بگرە فەرزکراوە— کە فێڵ لە ناجوولەکان بکرێت.

١٤. داوێن پیسی لەگەڵ کەسانی ناجوولەکە ئاساییە.

١٥. ژنی جوولەکە بۆی نییە سکاڵا لەسەر مێردەکەی تۆماربکات ئەگەرچی لەسەر جێگای هاوسەریشیاندا داوێن پیسی ئەنجام بدا.

١٦. هەر جوولەکەیەك لە خەویدا بیبنی لەگەڵ دایکی خۆی جووت بووە، ئەوا مانای وایە زیرەکی دەبێتە بەشی.

١٧. ئەوەی لە خەودا بیبنی لەگەڵ دەزگیرانەکەیدا جووت بووە، مانای وایە بە ئایینەوە پابەندە.

١٨. ئەوەیش کە خەوی بە جووتبوون لەگەڵ خوشکی خۆیدا بینی، مانای وایە ڕووناکی عەقڵ دەبێتە بەشی.

١٩. ئەو کەسەش کە لە خەویدا لەگەڵ ژنێکی نزیکی خۆی جووت دەبوو، ژیانی ئەمری بۆ دەبێت.

٢٠. جوولەکە دەڵێن ((پێویستە کچە جوانەکانمان بدەینە پاشا و ئەمیر و وەزیر و کەسانی بەرز، وەهەروەها ئەوەکانی خۆمان بخزێنینە نێو ئایینە جیاوازەکانی جیهان، تاوەکو ببینە خاوەن بڕیاری یەکلاکەرەوە لە وڵات و حکومەتەکاندا و ناکۆکییان بخەینە نێوان و ترسیان سەبارەت بە یەکتری بخەینە نێو دڵ تاوەکو بەشەڕیان بهێنین لەگەڵ یەکتریدا، لەمەشدا ئێمە زۆرترین قازانج دەکەین)).

٢١. بریۆ و فیسح دوو جەژنی جوولەکانن، خۆشی و ئاهەنگ گێڕانیان تیادا ناگاتە لووتکە ئەگەر خواردنێکی تێکەڵ بە خوێنی مرۆڤایەتی تیادا نەخۆن.

# بەشی چوارەم

## نموونەی خراپەکاری جوولەکە لەسەر زەوی

١. جوولەکە بوون کە هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریان دا لە بن دیوارەکە، هەروەها هەوڵیاندا بەردێکی گەورەی بەسەردا بەردەنەوە. هەر جوولەکە بوون گۆشتی مەڕیان ژاراوی کرد و دایان بە پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خودای لێبێت). هەر (لەبیدی کوڕی ئەعسەم)ی جوولەکە بوو کە جادوویەکی یەکجار توندی لە پێغەمبەر(درودی خودای لێبێت) کرد و بەهۆیەوە تەندروستی خۆشەویست (درودی خودای لێبێت) زۆر تێکچوو.

٢. جوولەکە بوون عومەری کوڕی خەتتابیان (خودای لێ ڕازیبێت) شەهیدکرد.

٣. جوولەکە بوون کە فیتنەیان هەڵکرد و خەڵکیان لەسەر ماڵی عوسمان (خودای لێ ڕازیبێت) کۆکردەوە و بەسەر دیواری ماڵەکەی هەڵگەڕان و هانی خەڵکانی بێعەقڵیان دا تاوەکو

یەکێکیان خوێنی گەرم بوو و چووە سەر سنگی عوسمان و
چەقۆکەی کرد بە ملی پیرۆزی عوسماندا و شەهیدی کرد.
٤. جوولەکە بوون کە ناکۆکی نێوان عەلی و معاویە لەلایەك و عەلی و
عائیشە لەلایەکی دیکەیان دروستکرد.
٥. جوولەکە عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان (خودای لێ ڕازیبێت)
شەهیدکرد.
٦. هەر جوولەکەن کە هێشتاش لە وڵاتانی موسوڵماناندا هەوڵی
نانەوەی خراپەکاری دەدەن.

## ئێستاش فەرموو لەگەڵ درێژەی ئەوانەی ڕابرد:

هیچ کاتێك جوولەکە لە پیلانگێڕی و نانەوەی ئاژاوە نەوەستاون بۆ لاوازکردنی موسوڵمانان، بۆ ئەم مەبەستەش پەنایان بۆ چەندەها پیلانی ژەهراوی برد کە لەوەوپێش لەگەڵ مەسیحییەکان کە دوژمنی یەکەمیان بوون بەکاریانهێنابوون. هەڵسان وایان نیشاندا کە بوونەتە موسوڵمان بۆ ئەوەی بتوانن ژەهری خۆیان بڕێژن و ڕەگی گومان بچێنن و خەڵکی بەلاڕێدا بەرن و فرت و فێڵ لەنێوانیان بڵاوبکەنەوە لەکاتێکا بەرگی موسوڵمانانی لێبوردەیان پۆشیبوو. لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففاندا (ڕەزای خودای لێبێت)، جوولەکە

مەسیحییەکان بەڵام هەڵەی ئەوە کە موسوڵمانان و ئیسلام تووشی بووبێتن، کە ئێستاکان کاریگەرییەکانی هەر ماوە، کە بریتی بوو لەو کۆمەڵەیەی کە عەبدوڵڵای کوڕی سەبە دروستی کرد و هاندیان و یارمەتی کردن، ئەم عەبدوڵڵایە ناناوی (ئیبنولسەودا) بوو کابرایەکی جوولەکەی خەڵکی یەمەن بوو، لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا (خوای لێ ڕازیبێت) وای نیشاندا کە موسوڵمانە و لە وڵاتێکی ئیسلامی بەرەو یەکێکی دیکە گەشتی دەکرد و تۆوی گومانی خۆی لەنێو دڵی خەڵکەکەیدا دەچاند، تاوەکو گەیشتە میسر، لەوێ قسەی بۆ خەڵك کرد و گوتی ((چۆن بڕواتان بە گەڕانەوەی عیسای مەسیح هەیە و بڕواتان بە گەڕانەوەی موحەممەدی پێغەمبەری خۆتان نییە؟ ئەی چۆن لە زەوتکردنی جێنشینیی پێغەمبەر لەلایەن عوسمانەوە لە بنەماڵەی پێغەمبەر چاوپۆشی دەکەن و بێدەنگ دەبن؟))، بەمجۆرە عەبدوڵڵای جوولەکە کەوتە ناوزڕاندنی عوسمانی کوڕی عەففانی جێنشینی موسوڵمانان.

کوڕی سەبە بانگەوازکەرانی خۆی بڵاوکردەوە، چەند کۆمەڵەیەکی نهێنی دامەزراند کە ئیشیان ئەوە بوو ژەهری دووبەرەکی لە هەموو پارچەیەکی وڵاتی موسوڵمانان بڕێژن، کاتێکیش هەل بۆ ڕێککەوت و ئامادە بوو، پیلانگێڕەکانی هاوەڵی تاوانی کوشتنی عوسمانی کوڕی

عەففانیان بە دڕندانەترین شێوە ئەنجامدا کە لە تەلمودی جولەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو. دوای ئەم تاوانە قێزەونە، کوڕی سەبە دەستی کرد بە بانگەشەی خوایەتی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ ڕازیبێت)، کاتێك عەلی ئەم قسانەی پێگەیشتەوە ئاگرێکی هەڵکرد و بێژەرانی وەها گوفتارێکی سووتاندن و کوڕی سەبەئیش ڕایکرد. خۆ کاتێکیش عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ ڕازیبێت) شەهیدکرا، کوڕی سەبە ئەو ڕووداوەی ڕەتکردەوە و وای نیشاندا کە خودا ناکوژرێت و عەلی زیندووە و بەشی یەزدانی تێدایە، ئەوە عەلییە کە لەگەڵ هەورەکان دێت و گرمەی هەور دەنگی ئەوە و برووسکەش قامچییەکەیەتی.

خۆ ئەم بانگەوازی بە خودا زانینەی حەزرەتی عەلی شتێکی نوێ نەبوو لەلایەن جوولەکانەوە، پێشتریش کاتێك نەیانتوانی بەسەر ئاینی مەسیحییەتدا زاڵبن، پیلانی بە خودا زانینی عیسای مەسیحیان دارشت. لەسەر بناغەی کردن بە سیان یان سێ تەنە پیرۆزەکە ئەم کارەیان لە ڕێگەی پۆلسی پەیامبەرەوە ئەنجامدا، بەمجۆرە هەروەکو بەڵایان بەسەر هاوەڵانی مەسیح هێنا لە بڕوایان سەبارەت بە عیسا، هەر ئاواشیان لەگەڵ عەلی و هاوەڵانی کرد، هەردووك بەڵاش لە کارگەی جوولەکە دروستکرابوون.

بڵێسەی ئاگری ئەو دووبەرەکییەی نێوان موسوڵمانان تەنانەت دوای کوشتنی عوسمان و عەلی و حوسەینی کوڕی عەلی هەر بەردەوام بوو، خەڵکانێکی زۆری موسوڵمان گوێیان بۆ ئەو بانگەوازی دووبەرەکی و بەمارگیریانە شلکرد کە پێش هاتنی ئیسلام هەبوون و ئیسلام ئاوری بردبوون و دەیانویست دووبارە سەرهەڵدەنەوە.

ئەو جوولەکانەش کە لە سەردەمی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لێبێت) نەیانتوانیبوو ڕیشەی دووبەرەکی لەنێوان هۆزەکانی ئەوس و خەزرەجی مەدینەی پیرۆز بچێنن، دوای کۆچی دوایی حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) و لە سەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتتابدا (خوای لێ ڕازیبێت) بەم ئاواتەیان گەیشتن.

دوای ئەوەی ئیسلام پێکهاتەی جوولەکانی لە حیجاز نەهێشتن و دەری کردن، ئیتر نەیانتوانی بەئاشکرا لەسەر شانۆکە وەدەرکەونەوە، بەڵکو لەپشت پەردەوە پیلانەکانی کوڕی سەبەئی سەرۆکی خۆیان ئەنجامدەدا.

دوای ئەوەی بزووتنەوەی سەبەئی توانی ڕیشەی دووبەرەکی لەنێو موسڵماناندا بچێنێت، چەندەها لقی تێکدەر لەم بزووتنەوەیە بێنەوە کە هەریەکەیان لە لاوازکردنی موسوڵماناندا ڕۆڵی هەبوو،

ناخۆشی و کێشەیان بەسەر گەلی موسوڵماندا هێنا. لە ترسناکترینی ئەو بزووتنەوانەش بزووتنەوەی ئیسماعیلی بوو کە کۆمەڵەیەکی نهێنی هاوشێوەی هەریەك لە کۆمەڵە نهێنییەکانی جوولەکەی پێکهێنا، هیچ کەسێك ئامانج و دەستوورەکەیانی نەدەزانی جگەلە سەرکردە کەمینەکانی و ڕێبەرانی هزری کۆمەڵە کە لە سەرکردەکەیانەوە نزیك بوون. دامەزرێنەری یەکەمی ئەم بزووتنەوەیەش کابرایەکی جوولەکە بوو بەناوی عەبدوڵڵای کوڕی مەیمونی قەدداح، ئەم جوولەکەیە بزووتنەوەکەی خۆی بەناوی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادقەوە ناونا.

مێژوونووسان لە ڕوونکردنەوەی بنەماکانی ئیسماعیلییەت ڕای جیاوازیان هەیە، لە قێزەونترین ئەو شتانەش کە دەدرێنە پاڵیان بریتییە لە خواستنی کچ لەلایەن برای خۆیەوە، ڕێگەپێدانی نێربازی، خواردنەوەی مەی، درۆ و دووڕوویی و فرت و فێڵ و هەلپەرستی و ڕقی تایبەت لە عارەبان کە هەموو ئەمانەش لە خاسیەتەکانی جوولەکانن.

دەستی شاراوەی جوولەکە لە بزووتنەوەی .قەرامیتەشدا هەبوو، تاوەکو خەلیفە موعتەزید ئەوانی ئاشکرا کرد، کاتێکیش زۆریان بۆ عەزرای کوڕی سامۆیلی گەورە بازرگانی جوولەکەی بەغدا هێنا، دانی

بەوەدا نا کە جوولەکە یارمەتی داراییان پێشکەش بە قەرامیتە و بزووتنەوەکانی بابەك و سەبەئییەکان و مەیمونی قەدداح کردووە، هەروەها دانی نا بە یارمەتی نهێنی جوولەکە بۆ ڕۆمەکان. سەرەڕای ئەوەی لێبوردەیی موسوڵمانەکان لە سەردەمی عەباسییەکاندا خۆشی و ئارامی بەسەر جوولەکاندا باراندبوو و پارە و سامانێکی زۆریان لە بازرگانی و سووخواردنەوە وەدەستهێنابوو، بەڵام ئەوان یارمەتی هەر بزووتنەوەیەکی گێرەشێوێنییان دەدا کە لەنێو وڵاتی موسوڵماناندا سەریهەڵدایە.

پەنجەی جوولەکە لەنێو ئەو بەڵایانەی بەسەر موسوڵمانەکاندا دەهاتن بەردەوام بوو لە جووڵە و کارکردن، بەشێوەیەك کە زۆرینەی مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە عوبەیدوڵڵای مەهدی دامەزرێنەری دەوڵەتی فاتیمی لە مەغریب جوولەکە بووە. ناوبراو چووەتە ناو مەغریب و ناوی لەخۆی ناوە عوبەیدوڵڵا و وای نیشانداوە کە عەلەوییەکی بەڕێزی فاتیمییە، نازناوی (مەهدی)شی بە ناوەکەی خۆیەوە لکاندووە.

مێژووی فاتیمییەکان بێ هیچ گومانێك ئاماژەی ڕێوشوێن و دەستوورەکانی جوولەکەی تەوراتی و تەلموودی تیایە، هەروەکو بە خودا زانینی پاشاکانیان، هەروەك (حاکم بیئەمریللا) داوای خوایەتی

کرد! ئیتر شوێنکەوتووانی لە هۆزەکەی دەیانگوت: ئەی تاك ر
تەنهامان! ئەی زیندووکەر، ئەی مرێنەر!
زانایانی موسوڵمان وشەی جوولەکەییەکان بەسەر هەموو شتە
داهێنراو و بیروباوەڕی پووچ و ئەو دەستوور و داستانانەی ک
جوولەکە و نۆکەرە موژدەدەرەکانیان هۆنیویانەتەوە و ڕۆژهەڵاتناسە
جوولەکەکان دەیانقۆزنەوە بۆ زاڵبوون بەسەر ئیسلامی پاك.
لەنێو ئەو جولەکەییانەش، هەندێك چیرۆکی خەیاڵین کە لە هەندێك
تەفسیردا جوولەکە تێکەڵ بە پێشبینییەکانی کۆتایی جیهانیان
کردوون، چەندەها داستانی خەیاڵی، ژمارەیەك فەرموودەی
هەڵبەستراو بە زاری پێغەمبەری مەزن (درووودی خودای لێبێت) کە
هیچ هزرێکەی ساغ قەبووڵیان ناکات. ئەمە ئەو پیلانە بوو کە
جوولەکە بۆ لاوازکردن و شێواندنی ئیسلام لە سەدەی یەکەمی
کۆچییەوە کاریان لەسەر کردووە، ئێستاش بە سەختی پێیەوە
دەناڵێنین، خۆ ئەگەر هۆکاری هێزی شاراوەی نێو ئەم ئایینە نەبایە،
حەوت زەمان بوو جوولەکە توانیبوویان بەهۆی تەڵەکە و پیلانەکانیان
ئیسلام لەناوبەرن هەروەك وایان لە ئایینی مەسیحییەت کرد.

# بەشی پێنجەم

## جوولەکە و ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی

دوا خەلیفەی موسوڵمانان کە سوڵتان عەبدولحەمید بوو؛ ڕووبەڕووی فشاری سەهیۆنییەکان بە سەرکردایەتی ((تیۆدۆر هرتزل)) بوویەوە، کە داوایان لێی دەکرد لە بەرامبەر پارەیەکی یەکجار زۆردا لێبگەڕێ جوولەکە لە فەلەستین نیشتەجێ بن، بەڵام سوڵتان زۆر بەتوندی ڕەتیکردنەوە. بۆیە جوولەکە لەڕێی ماسۆنیەتەوە هەوڵیاندا لە دەسەڵاتی لابدەن. کۆمەڵەی (ئیتیحاد و تەرەقی) و جوولەکەکانی دۆنما کە خۆیان خزاندبووە نێو کۆمەڵەکەوە، بە نهێنی و بێ ئەوەی موسوڵمانان بە هەنگاوەکانیان بزانن سوڵتانی پایەبەرزیان لە دەسەڵات هێنایە خوارێ و کورسییەکە بووە بەشی تاوانکارەکانی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی.

هەروەکو بانگەشەی جوولەکەکان سەرکەوتوو بوو لە لکاندنی گەندەڵی و خراپەکاری بە خەلیفە و خەلافەتی ئیسلامی و بەدەرخستنی و زل

کردنی وێنەی پاڵەوانی بۆ جوولەکەی پیس ((موستەفا کەمال ئەتاتورك)) کە جێبەجێکاری نەخشەی جوولەکان بوو بۆ ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی و تاوەکو لەسەر پاشماوەی خەلافەتی عوسمانیدا حکومەتە لێکپچڕاوەکان دروستبکرێن کە بەکرێگیراوی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوان. ئەتاتورك بەم شێوەیەی خوارەوە نەخشەکەی جێبەجێکرد:

١. دوایی بە خەلافەتی ئیسلامی هێنا.

٢. تورکیای لە پارچەکانی دیکەی دەوڵەتی عوسمانی جیاکردەوە، بەم کارەشی دەوڵەتی مەزنی ئیسلامی تێکشکاند.

٣. علمانییەتی بێباوەڕی ڕاگەیاند و ئایینی لە دەوڵەت جیاکردەوە، دواتریش ئەم نوێکارییە گومڕاییە لە زۆربەی وڵاتانی موسوڵمان بڵاوبوویەوە.

٤. زانایانی موسوڵمان بە دڕندانەترین شێوە چەوسانەوە و بە دەیانیان شەهیدکران و جەستەکانیان بەسەر دارانەوە هەڵواسران.

٥. زۆر لە مزگەوتەکان ڕووخێنران و بانگدان و نوێژکردنی بە زمانی عارەبی یاساغ کرد.

٦. میللەت ناچارکران واز لە جلی ئیسلامی بهێنن و جلی ئەورووپی بپۆشن.

٧. وەزارەتی ئەوقاف هەڵوەشێنرایەوە و نوێژکردن لە مزگەوتی ((ئەیا سۆفیا)) قەدەغەکرا و مزگەوتی ناوبراو کرا بە مۆزەخانە.

٨. دادگا ئاینییەکان هەڵوەشێنرانەوە و دەستووری مەدەنی سویسری بەسەر خەڵکدا سەپێنرا.

٩. پشووی هەفتە لە ڕۆژی هەینییەوە کرا بە ڕۆژی یەکشەممە.

١٠. بەکارهێنانی ساڵنامەی کۆچی ڕاگیرا و لەجێی ئەوە ساڵنامەی زایینی ڕۆژئاوایی کەوتە واری بەکارهێنان.

١١. یاساکانی میرات و هاوسەرگیری و باری کەسێتی کە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە هەڵێنجرابوون ڕەتکرانەوە، فرەژنی و تەڵاق قەدەغەکرا ژن و پیاو یەکسان کران لە میراتدا.

١٢. کچان و کوران بەرەو ڕووتی و داوێنپیسی هاندران و کارە خراپەکان ڕێگەیان پێدرا، بەمەش وڵات بووە نموونەی هەرە قێزەونی لادانی ڕەوشت و ئالوودەبوون لە مەی و داوێنپیسی.

١٣. فێرکردنی ئیسلامی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن هەڵگیرا، قوتابخانەکانی قورئانی پیرۆز داخران و پیتی لاتینی خرانە جێی ئەو پیتە عارەبییانەی کە تورکەکان هەزار ساڵ بوو بەکاریاندەهێنا.

١٤. هەوڵدرا بۆ لابردنی وشە عارەبییەکان لەنێو زمانی تورکیدا، وەك نیشانەیەك بۆ دووربوونی تەواو لە ئیسلام.

١٥. دەرگای وڵاتی تورکیا بۆ ئەو زانا جوولەکانە خرایە سەر پشت کە لەلایەن ئەلمانیایەوە دەرکرابوون و لە دامەزراندنی زانکۆی تورکیدا پشتیان پێ بەسترا، هەروەها ژمارەیەکی زۆری مامۆستای جوولەکە بانگهێشت کران بۆ فراوانکردنی بەشەکانی زانکۆکە.

١٦. پارتی گەل دامەزرا، کە لەرێگەیەوە هەموو ئامرازەکانی ترس و تۆقاندن لەدژی گەلی تورکی موسوڵمان بەکارهات.

# بەشی شەشەم

## پلانەکانی جوولەکە

ئەم کۆمەڵە پیسەی مرۆڤ (جوولەکە)، سەرلێشێواوی و تێکدەری و دەمارگیریی و خراپەکارییان کردۆتە ئایینی خۆیان، شەیتان لەوان شیاوتری دەستنەکەوتووە کە بیانکاتە ئامرازی بە لاڕێدا بردنی مرۆڤایەتی و کاولکردنی نەتەوەکان و ڕێبەری کردنی مرۆڤ بۆ نێو دۆزەخ. ئەوان مامۆستای جادوون لە جیهاندا، ڕێنوێنییەکانی پەرتووکی ((کەبالا)) کە یەکێک لە پەرتووکە پیرۆزەکانیانە، هیچ شتێك نییە جگەلە هونەری جادوو کردن کە تیایاندا دەبێت کەسەکە لە شەیتان بپارێتەوە، ئەمانە لە کۆنیشەوە ئەو کارەیان هەر کردووە، هەروەك یەزدان دەفەرمووێت: (واتبعوا ما تتلو الشیاطین علی ملك سلیمان).

